# حوكمی بەشداریكردن لە حوكمەتەكانی كوفر و عەلمانی سەردەم

ئامادە كردنی

مامۆستا إسماعیل سوسەیی

نوسینەوەی

أبو أنس الكردی

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يَضْلُلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدُهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدَاً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ،

موسوڵمانانی بەڕێز و سەنگین ئەم باس و بابەتە کە نوسراوەتەوە و بەشێوەی پەرتووک و نامێلکەیەک لەبەر دەستتاندایە بریتییە لە دوو ئەڵقەی (سێ پێگەی ڕاگرتنی کوفر و ستەم لە دیدگای قورئان و فەرموودە) کە مامۆستای بەڕێز إسماعیل سوسەیی ماوەیەك بەر لە دەستگیر کردنی لە مانگی ڕەمەزاندا پێشکەشی کردووە، ئێمەش ئەم ماوەیە لەبەر گرنگی باس و بابەتەکە هەستاین بە نوسینەوەی.

لە کۆتایدا داواکارم لە الله تعالی پاداشتی بە خێری مامۆستا بداتەوە، وە ئێمەش بپارێزێت لە ڕیا و گومڕایی و هەوا و ئارەزوو امین.

**٢٠٢١/٧/٢٥**

**ابو انس الکردی**

# حوکمی بەشداریکردن لە حوکمەتەکانی

# کوفر و عەلمانی سەردەم

موسوڵمانانی بەڕێز و سەنگین وەکو وادە و بەڵێنمان پێتان دابوو ئەو باس و بابەتەمان تەرخان کردووە بۆ حوکم و بڕیاری شەرعی دەربارەی سەرباز و پۆلیس و دار و دەستە و پێگەی ڕاگرتنی طاغوت و کافر و ستەمکاران، ئایە ئەوانە حوکم و بڕیاری شەرعی لە سەریان چییە؟ لە هی سەردەمی فیرعەونەوە تا بە سەردەمی ئێمەش دەگات، ئەوانەی ئەو کوفر و ستەم و طاغوتییە ڕا دەگرن کە کۆڵەکەن بۆیان و ئەو کوفر و ستەمە لەسەر ئەوانەوە وەستاوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە لە خۆمانی دەکەین ئایە کافر دەبن یان تەنها تاوان کارێکن و حوکمی شەرعی لەسەریان چییە؟ وەڵامەکەی دەدەینەوە بە پشتیوانی الله تعالی بە وردی گوێمان بۆ بگرن بەڵکو سود و کەڵکی لێ وەرگرن.

ئەو دەسەڵاتدارە کوفر و ستەمیانەی کەوا کوفر و ستەمەکە دەکەن و دەیچەسپێنن بەسەر خەڵکی و سیستەمی کوفری پیادە دەکەن و پەیڕەوی دەکەن بەسەر جەماوەر و خەڵکیدا پێویستی دەکەن و بە ئاگر و ئاسن جاری وایە دەیسەپێنن بە سەریانەوە لەسەر شان و ملیان دادەنێن، بە یارمەتی چەند کەس و دەزگایەک ئەو

کار و ئیشه دەکەن کە پێگەکانی ڕاگرتنی ئەو کوفر و ستەمەیە، هەندێکیان بە ڕاستەوخۆ پاڵپشتی کار و هاریکارن بۆیان وەکو دەزگا ئەمنیەکان و ئاسایش و پۆلیس و سەربازیەکان و هەواڵگری و ئەوانەی باجیان بۆ وەردەگرن و بەرپرسن لە سامانەکان بۆیان کۆ دەکەنەوە و بەر پرسی دارایی و ئابورین و ڕاگەیاند کارن، هەندێکیشیان بە نا ڕاستەوخۆ پاڵپشتی کار و هاریکارن بۆیان وەکو دەزگا و فەرمانگاکانی تر لەو دەسەڵاتانەی کەوا کوفر و ستەم ئەنجام دەدەن و سیستەمەکەیان کوفرییە، جا ئەوانەی بە نا ڕاستەوخۆ پاڵپشتی کار و هاریکارن وەکو زانایان دایان ناوە بە چەند مەرجێك لە فەرمانگاکان بۆیان هەیە دەوام بکەن و ئەو شوێنانە بگرن لە پێناو بە دەست هێنانی بژێوی ژیانیان، بەڵام دەبێت ئەو مەرجانەیان لێ بێتەجێ ئەو کات ڕێگا دراوە و شەرعی دەبێ و حەڵاڵە بۆیان ئەگەرنا خەتەر ناکە و ترسناکە پەنا بە الله، خۆ ئەگەر بەشداریش نەکەن و خۆیان دوور بگرن ڕزق و ڕۆزی بە کەسابەت و هەوڵدانی خۆیان پەیدا بکەن و بەڕائەتی تەواو و کولی بکەن ئەوەیان بۆ قیامەتی هەر کەسێک ڕەنگە چاکتر و لە پێشتر و ئەولا ترە بەڵام ئەگەر بەشداریشیان کرد لەو فەرمانگا و دەزگایانەی کەوا لەو حکومەت و دەسەڵاتانەیە کەوا کوفر و ستەم پەیڕەو دەکەن، بە

دڵنیاییەوە پێیان دەڵێین بەو مەرجانە زانایان ڕێگایان داوە و ئەگەر مەرجەکان نەیەتەجێ ئەو کاتە نابێت بەشدار ببیت:

١-کار کردن و فەرمانبەری کەسەکە نابێت کاری پێچەوانەی شەرعی لێ بکەوێتەوە وەکو کار کردن لە دادگاکان و پارێزەرایەتی کە ڕاستەوخۆ کار دەکەن بە یاسای دەستکردی زادەی بیری مرۆڤ کە پێچەوانەیە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام و یاساکانی الله تعالی.

٢-نابێت خودی کارەکە پشتیوانی و یارمەتی و سەرخستنی طاغوت و ستەمکارانی تێدابێت لە ستەم و کوفر و طاغوتیەکەیان چونکە الله تعالی لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز باسی ئەوەی کردووە پشتگیری کردن و سەرخستن و لەگەڵدا بوونی کەسی طاغوت و کافر و بێ دین و ستەمکار ئەوە ئەو کات لەوانت دەکا و وەکو ئەو حسابت بۆ دەکرێت وەکو الله تعالی فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ (سورة المائدة : ٥١) واتە: نابێت دۆست بن و پشتیوانی کار بن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا کافرن لە جولەکەو نەسرانیەکان و لە کافر و موشریکەکان و لە هەڵگەڕاوەکانیش، هەر یەک لە ئێوە پشتیوانیان بێ و

پشتگیریان لێ بکات و لەگەڵیاندابێ ئەوە لەوان حیساب دەبێت و وەکو ئەوان کافر و بێ بڕوا دەبێت، ئەگەر ستەمکاریش بن ستەمکار دەبێت.

٣-نابێت کارەکە قەدەغەیی لێ کرابێت بە دەقی شەرعی وەکو پۆلیسایەتی و عەریفایەتی و بەرپرسیاریەتی دارایی و ئابوری و پاراستنی ئابوری دارایی بۆ کوفر و سیستەمە دەسەڵاتدارە طاغوت و کافر و ستەمکارەکان، هەر وەکو لە فەرموودە هاتووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردووە ئەگەر دەسەڵاتدارانێك موسوڵمانیش بووبن بەڵام گوناهکار بووبن و تاوانیان ئەنجام دابێ و سەد لە سەد حوکمی الله ـیان جێبەجێ نە کردبێ ستەمکار بن فەرموویەتی لەو دەزگا و لەو دەسەڵاتە مەبنە عەریف عەریف واتە چەند کەسێکت لە بەردەست دابێت لەبەرژەوەندی ئەو دەسەڵات و دەسەڵاتدارەدا کار و ئیش بکەیت و بەرپرس بیت وە مەبنە پۆلیس بۆیان و مەبنە جابی پارەیان بۆ کۆ بکەنەوە و مەبنە خازینیش واتە بینە هەڵگری گەنجینە کانیان و بەر پرسی گەنجینە کانیان واتە مەبنە وەزیر و ڕاوێژ کار و جاسوس و بەرپرس و موختار و ئەوانە هەر هەمووی دەگرێتەوە.

٤-بەهێز کردنی خراپە و خراپەکاریەکانی خراپەکاران و کوفر و ستەمی ئەو دەسەڵاتدارەی لێ نەکەوێتەوە کە کافر و بێ بڕوایە، یارمەتی دەربێت لە خراپە

و خراپە کاریەکەدا چونکە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ﴾ (سورة المائدة : ٢) واتە: کۆمەکی یەکتری بکەن لەسەر چاکە و پارێزگاری وە کۆمەکی یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و دەست درێژی.

جا ئەگەر لە فەرمانگەیەکی خزمەتگوزاری و تەندروستی بەرەچاو کردنی ئەو مەرجانەی لە ڕابردوو گوترا کە زانایان دیاریان کردووە تۆ دەوامت کرد و بەشدار بووی ئەوە دروست و ڕێگا پێدراوە، ئەگەر تەواو بشبچرێی و ئەو ڕزق و ڕۆزییە لە ڕێگایەکی تر بە دەست بێنن وەکو گوتمان خۆت یەکلا بکەیتەوە بۆ الله تعالی ئەوە بە ڕاستی باشتر و پارێزکاری ترە.

جا دێینە سەر ئەوانەی کە بە ڕاستەوخۆ بەشدارن لە یارمەتیدان و پاڵپشتی کردنی کوفر و ستەمی طاغوت و کافر و ستەمکاران پێگە و ئەستوندەی ڕاگرایەتیانن، حوکم و بڕیاری شەرعی سەرۆکەکەیان دەیانگرێتەوە کە ئەگەر کوفربێ ئەوانیش کافر دەبن ئەگەریش تەنها ستەمبێ و دووربێ لە کوفر تەنها تاوانی ستەم کاری دەیانگرێتەوە چونکە الله تعالی فەرموویەتی:

﴿وَلاَ تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لاَ تُنصَرُونَ﴾ **(سورة هود : ١١٣)** واته: پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن و بێجگە لە الله هیچ پشتیوانێکتان نابێ پاشانیش یارمەتی نادرێن.

لێرەوە زانایان گوتویانە ئەو ئایەتە قەدەغەی دوو جۆرمان لێ دەکات و دوو جۆر کەسمان پێ نیشان دەدات لە دەسەڵاتداران:

١-تەنها ستەمکارن و ستەمەکەیان نەگەشتوەتە پلەی کوفر و شیرکەوە.

٢-کوفر و شیرکیشیان هەیە.

جا ئەگەر مەیلت کرد بە لای ئەوانەی کەوا تەنها ستەمکار بوون و کوفریان نەکردبوو تووشی نەبووبن تەنها گوناهبار دەبی و هاوبەش دەبیت لە ستەمەکەیان بەڵام کافر نابیت، بەڵام ئەگەر هاتوو کەسەکە کوفری دەکرد و ستەمیشی دەکرد وە مەیلت هەبوو بۆ لایان و بەلای ئەواندا چویەوە ئەوە ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە لە کوفرەکەشیان بەشدار دەبی و لە شیرک و هاوبەشیەکەشیان بەشدار دەبی و پێیەوە کافر دەبیت.

کەواتە با کورتە پوختی ڕای زانایان و بەڵگەکانیان بڵێین دەربارەی سەرباز و ڕاویژکار و پۆلیس و چەتەکانی دەسەڵاتدارانی کوفر و ستەم و فیرعەون و فیرعەون سیفەتەکان، لێرەدا دەمانەوێت بڵێین هیچ گومانمان لەوەدا نییە دار و دەستە و دەزگا ڕاگرەکان و سەرباز و پۆلیس و ڕاگەیاندکاران و کۆ کەرەوەی پارە و سامان و باج وەرگر بۆیان... بە ڕەهایی پێیان دەگوترێت کافر و هاوبەش بڕیار دەر بەڵام بە دیاریکردن و تەعین زانایان ڕا جیاوازن بەو شێوازەی داهاتوو.

## ڕای زانایان دەربارەی دار و دەستە و دەزگا ڕاگرەکان و سەرباز و پۆلیس و ڕاگەیاندکاران و کۆ کەرەوەی پارە و سامان و باج وەرگر بۆیان

١-کۆمەڵێک لە زانایانی جێگای متمانە فەرموویانە بە ڕەهایی و موتڵەقی پێیان دەڵێین کافر بەڵام بە تەعین و دیاریکراوی لێیان ورد دەبینەوە بزانین هیچ قەدەغە و مانیعێکی کافر کردنیان لێ نایەتەجێ، جا ئەگەر قەدەغەیەکیان لێ هاتەجێ ئەوە ئەو کاتە پێیان ناگوترێ کافر و کافریان ناکەین، ئەگەر هیچ مانیع و

قەدەغەیەکی کافر کردنیان لێ نەهاتەجێ ئەوە بە کافریان دەزانین بە دیاریکراوی و بە تەعین کردن.

٢-کۆمەڵێکی تر لە زانایان ئەوە ڕاو بۆچونیانە دەڵێن مادام لە داموو دەزگا ئەمنی و سەربازیەکانن و بەو شێوەیە پێگەی ڕاگرتنی ئەو کوفر و ستەمەن ئەوە هەموویان ڕاگری کوفر و طاغوتیەکەن و بە دیاریکراوی و تەعین پێیان دەگوترێ کافر و لە ئیسلام دەر دەچن.

جا کۆمەڵەی یەکەم کە دەڵێن بە گشتی و ڕەهایی بڕیاری کوفریان بەسەردا دەدرێت و بە تەعین و دیاریکردن پێیان نا گوترێ، دەڵێن لەبەر ئەوەی با بزانین قەدەغە و مانیعەکانی کافر بونیان لێ هاتوەتەجێ کە کافر نەکرێن پێیەوە یانە نا، جا دێین ئەو قەدەغە و مانیعانە لەسەر ڕاو بۆچونی ئەو زانایانە لەسەری دەڕۆین و دیاریان دەکەین.

## دریژەی ڕاو بۆچونی زانایانی کۆمەڵی یەکەم و ئەو مانیعانەی کە ئەی هێننەوە بۆ کافر نەکردنی ئەو سێ پێگەی کە ناومان هێنان

**١-(مانع الاكراه) واتە قەدەغەی نا چارکردن:** لە هەندێک سیستەم و دەسەڵاتی کوفری بە زۆرە ملێ خەڵکی ناچار دەکرێت بۆ سەربازایەتی و بەشداریکردن لەو داموو دەزگا سەربازی و ئەمنی و ئاسایشیانەی کەوا ئەو دەسەڵات و کوفریانە پێیوە دەپارێزرێن، کە جاری وا هەیە خەڵکەکە ناتوانێ لە دەسەڵاتەکە ڕابکات و سیستەمە کوفریەکە کە دژ و دوژمنە بە ئیسلام و الله تعالى و قورئان و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو لێیان بەریە و ڕقی لێ یانە بەڵام ناچار کراوە بە سەربازی کردن بۆیان، ئەوەش دەبێت مەرجەکانی ئیکراهی شەرعی لێ بێتەجێ کە زانایان دایان ناوە کە مەرجەکان بە کورتی و پوختی بریتین لە:

١-کەسەکە کە ناچاری دەکات دەسەڵاتی هەبێت کە هەڕەشەکەی لێ دەکات جێبەجێی بکات ئەگەر بە قسەی نەکات.

٢-هەڕەشەی کوشتن یان لە دەستدانی ئەندامێکی یان ئەشکەنجەدان و زیندانی زۆر و دوور و درێژ یان ناموس بردنی لێ بکات.

٣-مۆڵەتی ڕا کردن و دەرباز بوونی نەبێت لە دەستیدا.

٤-ئەو کاتەی هەڕەشەکەی لێ دەکات دەست بەجێ لێی جێبەجێ بکات و هەڕەشەکەشی ئەوە نەبێت کە لەوەوە بپەڕێتەوە بۆ کەسێکی تر داوای ئەوەی لێ بکات کەسێکی تر بکوژێت و لە ناوی ببات و یان ناموسی ببات، والله أعلم.

الله تعالى فەرموویەتی:

﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ (**سورة النحل : ١٠٦**) واتە: هەرکەسێك پاش بڕوا هێنانی بە الله، کافر و بێ باوەڕ بێتەوە، بێگومان سزای توند دەدرێ و، دەکەوێتە بەر قار و تووڕەیی الله مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێ و، لەوکاتەیشدا دڵنیابێ بەئیمان، وەکو (عەمماری کوڕی یاسر) الله لێیان خۆش بێت. (ئیبن عەباس) دەڵێت: موشریکەکان ئازار و ئەشکەنجەی (عەممار)یان زۆردا، بەرادەیەك گەیشتە حاڵەتێك لە ژێر سزادا تیا بچێت، ئەوسا لەبەر نا چاریی و بەدڵێکی پڕ لە ئیمانەوە ئەوانی رازیی کرد، جا بۆ دوایی هاتە لای پێغەمبەری الله (ﷺ) کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: لەو کاتەدا دڵت چۆن بوو؟ (عەممار) گوتی: دڵنیا بووم بەئیمان:

فەرمووی: دەسا ئەگەر ئەم جارەش ئەو حاڵەتە دووبارە بوویەوە، تۆیش جاران چیت گوتبوو بیڵێرەوە.

وە پێغەمبەری پێشەواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(إن الله قد تجاوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)** سنن ابن ماجه (ژ : ٢٠٤٣ – ٢٠٤٤ – ٢٠٤٥) واتە: بەڕاستی الله تعالى لەسەر ئومەتەکەی هەڵە و لەبیر چوونەوەی لاداوە و حیسابی لەگەڵ ناکات وە بە زۆرە ملێ و ناچاریش لەسەری حیسابی لەگەڵ ناکات ئەگەر کار و هەڵەیەک و گوناهێکی ئەنجامدا.

جا ئەوە ئەو کەسانە ناگرێتەوە بەڕێزان کە بە دڵ و خۆشی خۆیان بەبێ نا چاری و زۆرە ملێ کردن بەشدار دەبن لە دەزگا ئەمنی و ئاسایش و سەربازیەکان و دەبنە ئەندام تێیدا، جا ئەوانە بە دڵنیاییەوە بە کۆ دەنگی زانایان بە دیاری کراوی و تەعینی کافر دەکرێن و بە کافر دادەنرێن و قەدەغە و مانیعی (الاكراه) نایانگرێتەوە چونکە بە دڵی خۆیان بەشدار بوون خۆیان ویستویانە و هەڵیان بژاردووە، ئەوەش کە هەریەك لەو مەرجانەی ئیکراهەکەی لێ نایەتەجێ بە دڵنیاییەوە ئەویش بە دیاری کراوی کافر دەبێ ئەگەر بەشداری بکات لەو دەزگا و لەو شوێنانە و ببێتە سەرباز و ئەندام تێیدا بۆ کوفر و ستەم و سیستەمی کوفری

و فیرعەونیەت و فیرعەون سیفەتەکان، جا کەواتە لە پێناو مەعاش و بژێوی ژیان و بەو بیانوانە و یان دایکم یان باوکم داوای لێ کردم یان لەبەر خاتری فڵان و یان بۆ ئەوەی کەوا بژیم ئەی چیبکەم ئەوانە هەر هەمووی ئەگەر کەسەکە لەو پێناوانەدا بەشداری کرد بە تەعینی و دیاری کراوی زانایان بە کۆ دەنگی دەڵێن کافر دەبێت.

**٢- (مانع الجهل والتاویل) واتە قەدەغە و بیانووی نەزانین و تەئویل کردن:** جا بۆ تاک و گشتی خەڵکی نەزانین لە دوو لاوە بۆیان دێت واتە هەر کەسێک کە توشی نەزانین دەبێت یان بە گشتی خەڵکی عەوام کە توشی نەزانین دەبن لە دوو لاوە بۆیان دێت لەو باس و بابەت و بوارەدا، هەندێک جار داموو دەزگاکان ئەوانەی سەربازی و ئەمنی و ئاسایشن ڕێگا ناگرن بە ئەندامەکانیان کە هەندێک لە دروشمەکانی ئاینی وەکو نوێژ و ڕۆژو گرتن و قورئان خوێندن و زکر کردن ئەنجام بدەن و بیکەن کە کاریگەری نەبێت لەسەر سیاسەت و دەسەڵاتە کوفری و بێدینیەکەیان جا خەڵکی گشتی وا گومان دەبەن ئەو دەسەڵاتە موسوڵمان و شەرعییە و کافر و بێ دین نییە دەڵێن ئەی ئەوە نییە ڕێگا دەدات نوێژ بکەین ئەی ئەوە نییە ڕێگا دەدات ڕۆژوو بگرین ئەی ئەوە نییە دەهێڵن قورئان بخوێنین

بەوە فێڵیان لێ دەکرێت و ئەو گومانانە دەبەن نازانن ئەو دەزگا و جێگایانە تەنها بەوەندە بڕیار نادرێت کە موسوڵمانن و هەر بە کافری دەمێننەوە، جاری واش هەیە لە ڕووی ئەوە نەزانینەکەیان توش دەبێت کە هەندێک لە مێزەر بەسەرە جوبە لە بەرەکان یان بانگخوازان یان ئەوانەی تەنانەت پاشکۆی ئیسلامیشیان بە خۆیانەوە لکاندووە وە لە تاقم و کۆمەڵ و فیرقەکانی پێچەوانە لەگەڵ ئەهلی تەوحید و ئەهلی سونە و جەماعە بە خەڵکی دەڵێن و فێڵی ئەوەیان لێ دەکەن دەڵێن ئەو دەسەڵاتە و دەسەڵاتدارانە موسوڵمانن وە ئەمیرمانن گەورەمانن ئەگەر گوناە و تاوان و ستەم و گەندەڵیشیان هەبێت ناچنە بازنەی کوفرەوە، جا خەڵکی بڕوا دەکات پێیان و بە موسوڵمانیان دادەنێن و بەشدار دەبن لەم داموو دەزگایانە و دەخزێنە ناوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبەر ئەوەیە کە لە سونەندا هاتووە دەفەرمووێت: **(انما اخوف ما اخاف عليكم الأئمة المضلين)** واتە: ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر لەسەر ئومەتەکەم لێی دەترسێم ئەو پێشەوایانەن کەوا پێشی خەڵکیان گرتووە و پێشیان کەوتوون و بانگخوازن یان بە حیسابی خۆیان خەڵکی هۆشیار و ئاگادار دەکەنەوە خۆیان گومڕان و خەڵکیش گومڕا دەکەن، جا ئەو بیانوو و مانیعەی نەزانین بۆ ئەو دەزگا و دەسەڵاتانە نییە کە بە ئاشکرا دژایەتی

ئاینی ئیسلام دەکەن یان ئەندامەکانیان لە دروشمەکانی ئیسلام قەدەغە دەکەن زۆرێک لەو داموو دەزگایانە لەو سەردەمانەی خۆشمان بەر پرسەکان دەڵێن ئەگەر نوێژ دەکەی مەبە ئەندام لە لای ئێمە ئەگەر دروشمی ئیسلام ئەنجام دەدەی یان ئەگەر قورئان دەخوێنیت یان ئەگەر ڕیشت هەبێت یان ئەگەر سمێڵت قوت کردبێت یان یان یان... ئەوانە هەمووی یان تەنانەت هەندێك جار بۆمان گێڕدراوەیە لەو وڵاتانەی کە کاتێک هەبووە حوکمی ئیسلامی لێ کراوە و لە وڵاتەکەی خۆشمان داوای ئەوەیان لێ دەکرێت دەبێت عائیلە و خێزان و هاوسەرەکانیشیان خۆ داپۆش نەبن بە پۆشاکی شەرعی ئەگەرنا لێیان قبوڵ ناکەن و لێ ناگەڕێن بچنە ڕیزەکانیان و ببنە ئەندام لەگەڵیان، جا ئەو دەزگا و شوێنانە ئەگەر ڕێگای دروشمەکانیاندا ئەو بیانووە هەندێک لە زانایان بۆیان دەهێننەوە ئەگەر ڕێگای دروشمەکانیان نەداو بە ئاشکرا دژایەتی دین و دروشمەکانیان دەکرد و گەمە و گاڵتە و گەپیان پێ دەکرد ئەوە ئەو بیانوەیان بۆ نییە هەر یەک بەشدار بێ و ببێتە ئەندام لەوێ بە تەعینەن و دیاریکراوی بە کۆ دەنگی زانایەکان کافر دەبێت و لە ئیسلام دەر دەچێت، جا کەواتە خاڵێکی تر ئەگەر نەیدەزانی و تەئویلی دەکرد لە دوای ئەوەی حوجەی لەسەر کراو بۆی ڕوونکراوە ئەو کاتە

ئەگەر هەر بمێنێتەوە و بەشداری بکات دیسانەوە ئەو بیانوەی بە دەست نامێنێت و کافر دەبێت لەسەر ڕەئی ئەو زانایانەش کە دەڵێن ئەو بیانوەی بۆ هەیە، جا لە بار و زروفێکی وەکو ئەمڕۆ ئەگەر لێی وردبینەوە لە زۆربەی وڵاتان بە تایبەتی هی خۆشمان ئەو بیانووە هیچی بۆ نەماوەتەوە و نابێتە جێگای ئەوەی کەوا بە بیانوو بگیرێت لەسەر ڕای ئەو زانایانەش چونکە بە چەندین خاڵ و مەناطی تری کوفری ئا ئەوانە کافر دەبن بەوەی کەوا پشتگیری دەسەڵات و بەرەی کوفر دەکەن لە دژی موسوڵمانان و الله بەیەکگران لە هەموو شوێن و جێگایەکان وە لە بنەڕەتدا بە ئاشکرا ئەو دەسەڵات و داموو دەزگایانە دەمەزراون بۆ ئەوە، بڵاوی دەکەنەوە بەبێ شەرم و ترسیش کەوا دژن بە ئیسلام و دوژمنن بەرامبەر بە موسوڵمانانی الله بەیەکگر هەوڵی ئەوە دەدەن ئەشکەنجەیان بدەن بیانگرن یان لە ناویان ببەن و بیانکوژن ئاو کاتە بەو مەناط و حوکمە کوفریانەش کافر دەبن و ئەو بیانووە نایان گرێتەوە.

**٣-جاری وایە ئەو دەزگا و شوێنانە خەڵکانێک دەچنە ناوی و دەبنە سەرباز و ئەندام تێیدا بۆ کار کردن لە بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان و الله بەیەکگران یان بە نیازی زیان گەیاندن و لەناوبردنی ئەندام و کەسە طاغوت و کافرەکان:** جا

ئەوە لە لای زانایان بە چەند مەرجێك دروستە موسوڵمان بچێتە ناو ئەو داموو دەزگا و شوێنانە کە دەسەڵاتی کوفر و ستەمیشە لە ڕیزەکانیان ببێتە ئەندام، کە مەرجەکان بریتین لە:

١-دەبێت کەسێک لە زانایان یان لە سەرکردەی موسوڵمانان هەبێت و ڕای سپاردبێت بۆ ئەو کارە.

٢-دامەزراوبێت لەسەر بیروبڕوا و متمانە پێکراو بێت لە نهێنی پارێزی و چالاک بێت لە کارەکانی.

٣-زیانیان لێ بدات بە کوشتنیان یان بە زانیاریدان دەربارەی کار و پیلانەکان لە دژی موسوڵمانان و الله بەیەکگران وە بەرگری کار بێت لە موسوڵمانان و چەوساوان.

جا ئەگەر ئاوا بوو بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حوزەیفەی ناردە ناو لەشکری قورەیشیەکان لە ڕۆژانی کۆتایی جەنگی خەندەق و ئەحزاب کە هەواڵی بۆ بێنێت لە لای ئەبو سوفیان و لەشکری کافرەکان ئایە چی دەکەن دژ بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی بۆ بگوازێتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگایدا بچێتە ناویان، وە لە پاشان ناردنی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس بۆ لەناو بردنی سەر لەشکری

کافرەکان کە لەشکر کێشییان کردبوو دەیانویست هێرش بکەنە سەر شاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەدینە تاوەکو خالید بکوژێت چووە ڕیزەکانیان، لەسەر داوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەبدوڵای کوڕی ئونەیس خۆی بە کافر و بێ بڕوا نیشاندا و لە کۆتاییەکەدا خالیدی سەربڕی و سەرەکەی بۆ پێغەمبەر هێنایەوە (صلى الله عليه وسلم)، وە لە پاشان ناردنی مەحەمەدی کوڕی مەسلەمە بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف و ئەو ڕوداوانە، وە مانەوەی ڤەیرۆزی دەیلەمی لەناو لەشکری ابو اسود العنسی کاتێک کەوا خەڵکەکە زۆربەی هەڵگەڕانەوە لە یەمەنەوە ئەوەبوو ئەو مایەوە تاوەکو ابو اسود بکوژێت و خۆی وا نیشاندا کە بڕوای هەیە بە اسود العنسی و ئەویش موسوڵمان نەماوە لە کۆتاییەکەیدا ابو اسود ـی کوشت و ئەوەش لە لایەن پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دان بە کار و ئیشەکەیدا نراو تێکڕای سەحابیەکان ئەو کات پێی ڕازی بوون و پێی دڵ خۆش بوون.

ئەو ڕوداوانە بە سەحیحی لە سیرەوە هاتووە و باسکراوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دروستە بەو مەرجانەی لە پێشتر گوتمان زانایان ئاماژەیان پێ کردووە کەسێک بچێتە ناو ئەو داموو دەزگایانە و لە ڕیزی ئەواندا بێت و ئەو کاتە بتوانێت سود و

کەڵک و قازانج بە ئیسلام و موسوڵمانان بگەیەنێت و زەرەر و زیانیش بە کافر و طاغوتەکان بگەیەنێت.

جا زانایان کۆ دەنگن سەبارەت بە ئەندام و پلە بەرزە سەر سەختەکانی سەربازی و دەزگا ئەمنیەکان کە ئەوان بە دیاریکراوی و بە تەعینی کافرن و لە ئیسلام دەرچوون، ئەوەی گوتراوە تەنها بۆ ئەوانەیە کە پلەیەکی نزمیان هەیە و ڕۆڵێکی گەورەیان نییە ئەو بیانوانەیان بۆ دەهێندرێتەوە هەتا حوجەیان لەسەر دەکرێت، کەواتە ئەوانەی بە فەرمانی سەرکردە یان بە فەتوای زانایەکی متمانەی موسوڵمانانیش بە مەرجەکانەوە لە ناویان مابێتەوە لە پلە بەرز و گەورەکانیش بێت ئەو حوکمە نایگرێتەوە بە ڕەهایی و لە ڕواڵەتدا کافر دەکرێت بەڵام لە ڕاستیدا ئەو موسوڵمانە لە بەینی خۆی و الله تعالی بۆ قیامەت لەسەر نیەتەکەی خۆی زیندوو دەکرێتەوە ئەگەر موسوڵمانانیش لە کاتی شەڕ و جەنگدا پێی ڕا گەیشتن و نەیان ناسی لەناویان برد و کوشتییان هیچیان لەسەر نیە و هەر ئەوە بڕیاری شەرعیە، وە کۆ دەنگی موسوڵمانان و زانایان لەسەر ئەوەیە کە جەنگ و شەڕیان لە دژ دەکرێت ئەگەر ئەو بیانوانەشیان هەبێت و ئەو مانیع و قەدەغانەشیان هەبێت وەکو بەرەیەکی کوفری بە گشتی تەماشا دەکرێن و حوکمەکانی جەنگ و

جیهاد ـیان لەگەڵ جێبەجێ دەکرێت، وە ئەو ئەندام و سەربازەی بیانوەکانیش دەیگرێتەوە زانایان گوتویانە نابێت بە هیچ شێوە و شێوازێک بجەنگێت لە دژی موسوڵمانان هەر کاتێک ناچار کرا بۆ بردنی جەنگ و شەڕەکانی دژ بە موسوڵمانان و اللە بەیەکگران ئەگەر بەشداری بکات ئەو کاتە دەبێت چەکەکەی بشکێنێ و وای لێ بکات کە بەکار نەیەت وە بەهیچ نەوع و شێوازێک بۆی نییە تەقە بکات ڕووە و موسوڵمانەکان و شمشێر و چەکەکەی بەکار بێنێت، زانایان فەرموویانە با ئەو بکوژرێت چ بە دەستی موسوڵمانان چ بە دەستی هاوڕێکانی خۆی لە سەربازە کافر و بێ دینەکان کە لێی قایل نەبن و قبوڵ نەکەن ئەوەی کەوا دەیکات.

## ئێستاش هەندێک لە فەتواو وتەی زانایان

## لەو بارەیەوە دەخەینە بەر دەستتان:

١-ئیبن تیمیە -رحمە اللە- دەفەرموێت: **(وقد يقاتلون وفيهم مؤمن بكتم إيمانه يشهد القتال معهم ولا يمكنه الهجرة ، وهو مكره على القتال ، ويبعث: يوم القيامة على نيته ، كما في الصحيح عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال : يغزو جيش هذا البيت ، فبينما هم بيداء من الأرض إذ خسف بهم ، فقيل : يا رسول**

**الله ! وفيهم المكره ، قال : يبعثون على نياتهم)** واتە ئەوانەی کەوا شەڕ و جەنگ دەکەن و بڕوا داریشیان لەگەڵ دایە بڕوا دارەکە ئیمانەکەی خۆی شاردوەتەوە و بەشدار دەبێت لە شەڕ و جەنگەکە لەگەڵ ئەوان وە نەی توانیوە کۆچ و هیجرەت بکات، وە ناچار کراوە و موکرەهە بە مەرجە شەرعیەکان لەسەر دژایەتی و جەنگ کردن لە دژی موسوڵمانان، ئەوە لەسەر نیەتەکەی خۆی لە قیامەتدا زیندوو دەکرێتەوە، هەر وەکو لە فەرموودەی صەحیح لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی: لەشکر و جەیشێک دێت بەرەو کعبة الله بۆ ئەوەی داگیری بکات، لە بەیدا لە شوێنێک لە سەحراو چۆڵەوانی پێش ئەوەی بگاتە مەککە و کعبة الله لە زەویدا ڕۆدەچن و خەسف دەبن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) ! کەسە ناچار و زۆر لێ کراوەکەشیان لەگەڵ دایە، فەرمووی بەڵێ ئەوان لەسەر نیەتی خۆیان زیندوو دەبنەوە کە خەسف دەبن لەگەڵ ئەوان لە دونیادا بەڵام لە قیامەتدا الله تعالى لەسەر نیەتی خۆیان زیندویان دەکاتەوە، **(وهذا في ظاهر الأمر وإن قتل وحكم عليه بما يحكم على الكفار فالله يبعثه على نيته)** ئیبن تیمیە دەفەرموێت ئەگەر لە ڕواڵەتدا بشکوژرێ و حوکم و بڕیاری ئەوەی بەسەردا بدرێ کە بەسەر کافراندا دەدرێت بەڵام الله تعالى لە قیامەتدا لەسەر

نیەتی خۆی زیندووی دەکاتەوە، **(كما أن المنافقين منا بحكم لهم في الظاهر بحكم الإسلام ويبعثون على نياتهم)** هەر وەکو مونافق و دوو ڕووەکان کە لە نێو ئێمەی موسوڵمانانداا لە ظاهیر و ڕواڵەتدا حوکمی ئیسلام و موسوڵمانێتیان بەسەردا دەدرێ لە قیامەتدا لەسەر نیەتی ناو دڵی مونافقایەتی و کافرایەتیان زیندوو دەکرێنەوە. **(والجزاء القيامة على ما في القلوب لا على مجرد الظواهر)** جا لە قیامەتدا سزاو تۆڵە و پاداشتەکان لەسەر ئەوەیە کە لەناو دڵی چی هەیە نەک تەنها لەسەر ئەوەبێت لە ڕواڵەتدا چی بووە، **(ولهذا روي أن العباس قال : يا رسول الله ! كنت مكرها .)** جا لەبەر ئەوەی گێڕدراوەیە عەباسی مامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە جەنگی بەدر کە لە ڕیزی قوڕەیشیەکان هاتبووە سەر موسوڵمانان گیراو دیلکرا ئەو کاتە گوتی: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) ! من ناچار بووم و زۆرم لێکراوە. **(قال : « أما ظاهرك فكان علينا ، وأما سريرتك فإلى الله »)** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامیدا فەرمووی: ڕواڵەت و ظاهیریەکەت لە ئێمە دیارە کە لەگەڵ لەشکری کافرانی ئەی عەباس، ئەوەت لەسەر ئێمەیە و ئێمە ئەوەت لەسەر بڕیار دەدەین نهێنیەکەت و ناو دڵت دەگەڕێتەوە بۆ لای الله تعالى. لە

مجموع الفتاوى (١٩/ ٢٢٤ – ٢٢٥) وه له منهاج السنة (٥/ ١٢١ – ١٢٢) ئەو وتەی ئیبن تیمیه هاتووه.

وه له وتەیەکی تردا ئیبن تیمیه له مجموع الفتاوى (١٩/ ٥٢٩) فەرموویەتی: **(فلا ريب أن هذا يجب عليه إذا أكره على الحضور أن لا يقاتل)** جا ئەو کەسەی کەوا ناچار دەکرێت لەسەر ئەو فەتواو بۆ چوونه کەوا گوتمان دەبردرێت و ئاماده دەکرێت لەو لەشکرەدا که دژ به موسوڵمانان دەجەنگێت نابێت شەڕ و جەنگ بکات، **(وإن قتله المسلمون)** ئەگەر موسوڵمانەکان بیشیکوژن ئەو نابێت ئەوان بکوژێت و چەکەکەی بەکار بێنێت له دژیان، **(كما لو أكرهه الكفار على حضور صفهم ليقاتل المسلمين)** هەر وەکو کافرەکان که ناچاریان کردووه و زۆریان لێ کردووه ئامادەیکەن له ڕیزی خۆیان تا له دژی موسوڵمانان شەڕ و جەنگ بکات، **(وكما لو أكره رجل رجلا على قتل مسلم معصوم)** وه هەر وەکو پیاوێک ئەگەر پیاوێک ناچار بکات لەسەر کوشتنی موسوڵمانێک که هیچی نەکردبێت و بێ گوناه بێت، **(فإنه لا يجوز له قتله باتفاق المسلمين)** به یەک دەنگی موسوڵمانان نابێت ئەو کەسه بکوژێت ئەگەر ناچاریش کرابێت لەسەر کوشتنەکەی، **(وإن أكرهه بالقتل)** وه ئەگەر ناچار کرابێت بەوەی که ئەگەر

نەیکوژێ دەیکوژن با ئەو بکوژن، **(فإنه ليس حفظ نفسه بقتل ذلك المعصوم أولى من المكس)** جا بۆی نییە خۆی بپارێزێ و بهێڵێتەوە نەکوژرێ تاوەکو کەسێکی بێ گوناە و تاوان بکوژێ و ئەو بمێنێتەوە لە ژیاندا.

٢-پێشەوا القرطبي لە تفسير القرطبي (١٠/ ١٨٣) فەرموویەتی: **(أجمع العلماء على أن من أكره على قتل غيره أنه لا يجوز له الاقدام على قتله ولا انتهاك حرمته بجلد أو غيره، ويصبر على البلاء الذي نزل به، ولا يحل له أن يفدى نفسه بغيره، ويسأل الله العافية في الدنيا والآخرة.)** کە ئەو ئیجماع و کۆ دەنگیە ابن رجب الحنبلي و العز بن عبد السلام و ئیمامی القرطبي و هەندێک لە زانایانی تریش گواستویانەتەوە دەڵێ زانایان کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی یەکێک ئەگەر ناچار کراو زۆری لێ کرا لەسەر کوشتنی جگە لە خۆی بۆی دروست نییە بچێت ئەو کوشتنە ئەنجام بدات و یان ناموسی ببات بەوەی کەوا ئەگەر ناچار کرابێ جەڵدی لێ بدرێ و یان لەوەش زیاتری لەگەڵ بکرێت، بەڵکو دەبێت سەبر و ئارام بگرێت لەسەر ئەو بەڵاو تاقیکردنەوە کە بۆی دابەزیووە و بەسەریدا هاتووە، وە بۆی حەڵاڵ و دروست نییە کەوا کەسێکی تر بکاتە گیان فیدای

خۆی و ئەو بکوژێ تاوەکو خۆی بمێنێتەوە، با داوا لە الله تعالی بکات لە دونیا و لە قیامەتدا سەلامەتی بکات.

## درێژەی ڕاو بۆچونی زانایانی کۆمەڵی دووەم سەبارەت بە سێ پێگەی ڕا گرایەتی کوفر و ستەم

بەڕێزان و خۆشەویستان کۆمەڵێ دووەمی زانایان بە دیاریکراوی و دیاریکردن و تەعینەوە لە ڕواڵەتدا بڕیاری کوفر بەسەر ئەو کەسەدا دەدەن کە بەشدار دەبێت لەو دەزگا و لەو شوێنانەدا و دەبێتە ئەندام بەبێ هیچ ڕەچاو کردنێکی مانیعەکان یان ئەوەیە کافرە بە کافری ئەسڵی یان هەڵگەڕاوە دەبێت ئەگەر پێشتر موسوڵمان بوبێت، جا حوکم و بڕیاری تاکو کۆمەڵ و لایەنەکە وەردەگرێت ئەو تاکەی بەشدارە لەوێ وەکو سەربازێک وەکو ئاسایشێک وەکو پولیسێک وەکو ئەندامێک وەکو کەسێک و فەرمان بەرێک لەوێوە ئیش و کار دەکات و لەگەڵیاندایە ئا ئەو کەسە چ ڕاگەیاندکار بێت چ سەرباز بێت چ پۆلیس بێت چ ئاسایش بێت چ کەسێک بێت کەوا بە پارە و پول لە بواری مادیی و دارایی و

ئابوری بۆیان بەڕێوەبەرێ هەر کەسێك ئەندام بێت لەو دەزگا و شوێن و جێگایانە حوکم و بڕیاری کۆمەڵ و تاقمەکە کەوا کوفرییە بەسەر ئەو تاکەشدا دەدرێت ئەگەر سەرۆک و سەرکردەکەی کۆمەڵەکە کافر بێت یان هەڵگەڕاوە و موڕتەد بێت ئەوە تاکەکەش ئەو بڕیارەی بەسەردا دەدرێت، هەر وەکو موسەیلەمەی کذاب کاتێک کەوا داوای پێغەمبەرایەتی کرد پەنا بە الله تعالی کۆمەڵەکەی و ئەوانەی شوێنی کەوتبوون لە لایەن سەحابی و هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (رضي الله عنهم) ناویان لێ نرابوو (الطائف المرتدة) واتە: کۆمەڵە و تاقمی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام.

ئێستاش بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کۆ دەنگی زانایانتان بۆ دەهێنینەوە.

## کۆمەڵێ دووەمی زانایان ئەم ئایەتانە لە قورئانی پیرۆز بە بەڵگە دەهێننەوە:

١-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ﴾ (القَصَص : ٨)

واتە: بە ڕاستی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان هەڵەکاری بێ بڕوا بوون.

واتە سەربازەکانیش حوکم و بڕیاری شەرعی فیرعەون و هامانیان وەرگرت کە سەرباز بوون بۆ ئەوان لە دەزگاکانی ئەمن و ئاسایش و سەربازی و پێشمەرگایەتی و پۆلیسی فیرعەون و هامان کار و ئیشیان دەکرد جا ئەوان کەوا بڕیار درا کە هەڵە کارن وە کافرن وە بڕیار درا سەربازەکانیش هەڵەکارن وە کافریشن.

٢-الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾ (القَصَص : ٦)

واتە: دەمانەوێ ئەوانە لەو سەر زەویەدا دەسەڵات و حکومەتیان بۆساز بکەین، تا دەسەڵاتی وڵاتی میسر بگرنە دەست و بە بەرنامەی الله حوکم بکەن وە ئەوەی کە فیرعەون و هامان و لەشکرەکەیان لێی دەترسان نیشانیان بدەین.

جا کەواتە لێرەش الله تعالى سەربازەکانی هامان و فیرعەون حوکم و بڕیارەکەی لە دونیادا کە بەسەریان دێت لە ناوچوون و ئەوەی کە لێی دەترسان کە بەساریان بێت ئاکامیان هەر وەکو فیرعەون و هامان دەبێت سەرباز و ئاسایش و پۆلیس و سەربازەکان و پێشمەرگەکانی فیرعەون و هامان.

٣-الله تعالى فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ (القَصَص : ٤٠)

واتە: جا تۆڵەمان لە ئەو (فیرعەون) و لەشکرو سەربازەکانی سەندو تورِمان دانە ناو ئاوی نیلەوە ئینجا سەرنج بدە (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بوو.

واتە الله تعالى فیرعەون و سەربازەکانی فیرعەونیشی هەردووکیانی هەر نقوم کرد و نغرۆ کرد وە هەردووکیانیشی بە زاڵم و ستەمکار ناو برد و لەیەکی جیا نەکردنەوە.

٤-الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ﴾ (القَصَص : ٤١)

واتە: فیرعەون و کار بە دەستەکانی کە ڕێنمووی خەڵکیان دەکرد بۆ ئەوەی بچنە سەر ڕێبازی فیرعەون و خەڵکیان بانگ دەکرد بەوەی کەوا بچن بۆ ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا سەر ناخرێن.

کەواتە دار و دەستەکەی فیرعەون و پێگەی ڕاگرایەتی کوفر و ستەمی فیرعەون هەموویان حوکم و بڕیاریان وەکو فیرعەون وابوو لەو ئایەتەدا کە الله تعالی فەرموویەتی.

کەواتە لە هەموو ئایەتەکان دەرکەوت بەڕێزان و خۆشەویستان کە الله تعالی فیرعەون و دار و دەستە و سەربازەکانی هیچیانی لێک جودا نەکردەوە بەڵکو هەموویان هەم لە ڕووی ئاکام و دوارۆژ و عەزابی دونیایان وە هەم لە هی دوارۆژ و قیامەتیان وەک یەک بوون و یەک بڕیاریان لەسەر درا و یەک حیسابیان بۆ کرا، جا ئەوە ئەوەی لێ دەر دەکەوێت کە کوفر بە قسە و کردەوەیە نەک ئیلا بە بیروبڕوای ناو دڵەکان ئەوە لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، جا سەرباز و دار و دەستەکانی فیرعەن و فیرعەون سیفەتەکان کافر دەبن کافرن هەم بە قسە و هەم بە کردار کە شوێنی فیرعەون دەکەون و دەبنە سەرباز و لە داموو دەزگاکان بەشدار دەبن بۆ هێشتنەوە و ڕاگرتنی کوفر و ستەمەکەی فیرعەون و فیرعەونایەتی، جا ئەوانەن کە لە سیستەمە کوفریەکاندا بەشدار دەبن وە دەیان پارێزن و فەرمانە کوفریەکانیان جێبەجێ دەکەن حوکم و بڕیارەکەیان واتە هەم

به قسه و هەم به کردار کوفریان کردوه و کافر دەبن و وەکو سەرکردەکانیان وان به دیاریکراوی له ئیسلام دەر دەچن.

جا شوێن کەوتوانی موسەیلەمەی کذاب زانایان فەرموویانه ١٠٠ هەزار یاخود زیاتریش بوون له ١٠٠ هەزار هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (رضي الله عنهم) ناویان دەبردن به هەڵگەڕاوەکان، لەوە هیچ دوو دڵ نەبوون و کەسیان نەهاتن یەک به یەک تاقیان بکەنەوە بزانن دڵیان چی تێدایه چونکه به قسه و به کردەوە لەگەڵ ئەو تاقم و کۆمەڵه بوون و به دوای موسەیلەمەی کذاب کەوتبوون هەر هەمویانیان به هەڵگەڕاوە حیساب کردبوو به بڕوادار و موسوڵمانیان له قەڵەم نەدەدان، وەکو له منهاج السنة ئیبن تیمیه له (٧/ ٢١٧) ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێ ژمارەکەیان وابوو وە سەحابی و هاوەڵان وایان تەماشا دەکردن، جا الله تعالى لەبەر یارمەتیدانیان و پاڵپشتی کردنیان له فیرعەون دار و دەستەکانی فیرعەونی یەکسان کرد لەگەڵ ئەو له ڕووی کوفر و هەڵه و ئاکامی دونیا و دوارۆژیان هەمووی به یەکسانی بەبێ لێک جیاکردنەوە ناوی بردن و ناوی هێنان و عەزاب و ئەشکەنجه و ناخۆشیەکانی پێ تامکردن.

## له فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) ئەم

## فەرموودەیە بە بەڵگە دەهێنینەوە:

پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) عەباسی مامی کە لە جەنگی بەدر لەگەڵ لەشکری قوڕەیشیەکان هاتبووە سەر موسوڵمانان جیای نەکردەوە لە کافرەکان هەر چەندە عەباس ڕایگەیاند کە ئەو بە ناچاری هاتووە و پێشتر موسوڵمان بووە، بڕیاری وەکو کافرەکان بەسەردا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چونکە کار و کردەوەکەی ئەو پشتیوانی کردن بوو وە لەگەڵدا بوونی ڕیزی بەرەی کوفری بوو بۆ سەر موسوڵمانەکان وە حیسابی ئەوانی بۆ کرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، حیسابی ئەوەی نەکرد کە عەباس ڕایگەیاند ئەو موسوڵمانە و چی لەناو دڵی دابووە، ئەوەتا لە فتح الباري (٧/ ٣٢٢) وە لە مسند الإمام أحمد (ژ : ٣٣١٠) هاتووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە عەباسی مامی گوت: **(أفد نفسك وابن أخيك عقيل بن أبي طالب ونوفل بن الحارث وحليفك عتبة بن عمرو ابن جحدم أخا بني الحارث بن فهر فإنك ذو مال.)** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەی عەباس دەی خۆت ڕزگاربکە و پارە ببەخشە لە بەرامبەر خۆت و لە بەرامبەر هەردوو برازایەکەت عەقیلی کوڕی ئەبی طالیب و نەوفەلی کوڕی حاریث وە لە بەرامبەر هاو

پەیمانەکەت عوتبەی کوڕی جەحدەم جا تۆ خاوەن ماڵی و هەبووی. جا عەباس گوتی: **(إني كنت مسلما ولكن القوم استكرهوني)** ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) من خۆ موسوڵمان بووم جا خەڵکەکە زۆرە ملێیان لیَ کردم و بە ناچاری منیان هێنایە ئێرە و توشیان کردم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: **(الله أعلم بإسلامك ولكن إن يك ما تقول حقا فالله يجزيك)** جا الله زاناترە بەوەی لەناو دڵت هەیە ئەگەر تۆ ئەوەی دەیڵێیت حەق و ڕەوابێت بە دڵنیاییەوە و بەڕاستی الله پاداشتت دەکات، **(فأما ظاهر أمرك فكان علينا)** بەڵام ئێمە دەڕوانین لە ڕواڵەت و ئیش بەوە دەکەین لە ڕواڵەتی و ظاهیریت ئەوەت پێوە دیارە کەوا تۆ هاتی بۆسەر ئێمە و لە ڕیزی کافرەکانی.

جا ئیبن تیمیە -رحمە الله- لەسەر ئەو ڕیوایەتە فەتوای کافر بوونی هەموو ئەوانەیدا کە لە ڕیزی کافراندا دەجەنگن ئەگەر بڕواداری ناچار کراو و موکرەهیش بن لە ڕاستیدا و لە ڕواڵەتدا هەر کافرن وە بە کافر حیساب دەکرێن دەڵیَ بەڵگەکەم ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) وەکو لە مجموع الفتاوى (١٩/ ٢٢٤ – ٢٢٥) وە لە منهاج السنة (٥ / ١٢١ – ١٢٢) هاتووە.

## کۆ دەنگی هاوەڵ و سەحابیەکان (رضي اللّٰه عنهم):

هاوەڵەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (رضي الله عنهم) بە کۆ دەنگی تەماشای سەر و شوێن کەوتوانی هەڵگەڕاوەکانیان دەکرد واتە سەرکردە و سەرۆکەکانیان ئەوانەی شوێنیشیان کەوتبوون بە یەک چاو تەماشایان دەکردن و هەر هەموویان بە هەڵگەڕاوە دادەنا، ئەوەتا ئەبو بەکری سدیق کاتێک وەفدی بوزاخە هاتە لای کە وەفد و نوێنەری ئەسەد و غطفان بوون ئەو کاتە هاتبوون بۆ لای بۆ ئەوەی سوڵح بکەن کاتێك لە شکاندا بوون و بێهێز بوو بوون لەگەڵ پێشەوا ئەبو بەکری سدیق (رضي الله عنە) لە جەنگی ڕیدە و هەڵگەڕانەوە، پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی: **(وتکون قتلاکم في النار)** دەبێت دان بەوادا بنێن ئەوانەی کوژراون لە ئێوە بۆ ناو ئاگرن، واتە کافر بوون چونکە کافر بۆ ناو ئاگرە واتە کوژراوەکانتان بۆ ناو ئاگرە ئەوەی لێ وەر دەگیرێت.

لەبەر ئەوەیە پێشەوا ئیبن تیمیە -رحمە الله- لە مجموع الفتاوی (٢٨/ ٣١١ – ٣١٢) فەرموویەتی: **(والطائفة إذا انتصر بعضها ببعض حتى صاروا ممتنعين فهم مشتركون الثواب والعقاب)** جا تاقم و کۆمەڵ ئەگەر هەندێکیان پاڵپشتی هەندێکیان بکەن تا هەموویان بە یەکەوە ببنە ئەو کەسانەی قەدەغە بکەن لە

جێبەجێکردنی شەرعی الله تعالی ئەوان هاوبەشن هەم لە پاداشت و هەم لە تۆڵە و لە سزاش، کەواتە ئەگەر موسوڵمان بن پاڵپشتی یەک بکەن پاداشت وەردەگرن ئەگەر کافر و موشریک بن پاڵپشتی یەک بکەن لە قەدەغە بوون لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله تعالی ئەوە سزایان دەدرێت و تۆڵەیان لێ دەستێندرێتەوە وەک یەک **(فأعوان الطائفة الممتعة ، وأنصارها منها ، فيا لهم وعليهم)** جا ئەوانەی یارمەتیدەر و هاریکارن هی تاقم و کۆمەڵی قەدەغە بوو لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله تعالی، کە سەریان دەخەن، ئەوەی بۆ ئەوانە بۆ ئەوانیش دەبێت ئەوەی لەسەر ئەوانە لەسەر ئەوانیش دەبێت، واتە ئەوانەی یارمەتیشیان دەدەن حوکمیان وەکو ئەوانە ئەگەر کارەکەیان چاکبوو پاداشت دەکرێن ئەگەر تاوانبار بوون یان کافر بوون تۆڵەیان لێ دەستێندرێتەوە و دەکەوێتە سەریان **(لأن الطائفة الواحدة الممتنع بعضها ببعض الشخص الواحد)** چونکە یەک تاقم و کۆمەڵ ئەگەر قەدەغەبن لەوەدا کەوا پاڵپشتی یەک دەکەن لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله تعالی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان وەک یەک کەس وان و دێنە بەر چاو ئەو کاتیش یەک حیسابیان بۆ دەکرێت، واتە کۆمەڵ و تاقم ئەگەر هەندێکیان بە هەندێکیان سەرخران تاوەکو وایان لێبێت

قەدەغە کاربن لە جێبەجێکردنی شەریعەتی الله تعالی هەموویان هاوبەشن لە پاداشت و تۆڵەدا یەکن و شەریکن وە یارمەتیدەرانی تاقم و قەدەغە کار و سەرخەرانیشیان ئەوەی بۆ ئەوان هەیە بۆ ئەوانیش هەیە بە دڵنیاییەوە وە ئەوەی لەسەر ئەوانە دەکەوێتە سەر ئەوانیش چونکە تاقمێکی قەدەغە کار هەندێکیان بە هەندێکیان کارەکەیان بۆ دەکرێت و وەکو یەک کەس وان و حیسابیان بۆ دەکرێت.

**ئێستاش چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز و دیاریکردنی مەناطی حوکمی کوفری بەسەر ئەو دار و دەستە و سەربازان و پێگەی ڕاگرتنی کوفر و ستەمی فیرعەون و فیرعەون سیفەتەکان لە هەر کات و سەردەمێکدا دەخەینە بەر دەستتان:**

١-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (المائدة : ٥١)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکە و گاوور مەکەن بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە بێگومان الله ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات.

کەواتە مەناطی حوکم لەو ئایەتە بریتییە لە پشتگیری کردن و سەرخستنی کافران کەواتە هەر کەسێک و هەر لایەنێک پشتی کافران بگرێت و سەریان بخات بە تایبەت لە دژی موسوڵمانان جا فیرعەون و دەسەڵاتەکە ئەگەر کافر و کوفری

بوون ئەوەی سەرباز بوبێت لەگەڵیان کە پشتگیری کردووە و چووەتە ناو بازنەکەیان بە دڵنیاییەوە کافر دەبێت مەناطی حوکمەکەی ئەوەیە کەواتە تەنها لەگەڵ بوونیان لە ڕواڵەت کافری دەکات، وەکو پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە ڕابردوو بە مامی عەباسی گوت و ئەوەی لێ قبوڵ نەکرد لەناو دڵی کە موسوڵمان بووە و بە زۆرە ملێ و ناچاری هاتووە لە ڕواڵەتدا هەر وەکو کافرەکان حیسابی بۆ کرد.

٢-الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ **(النساء : ٧٦)**

واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە لە پێناوی الله دا دەجەنگێن وە ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی طاغوتدا دەجەنگێن کەواتە شەڕ بکەن لەگەڵ دۆستەکانی شەیتاندا بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە.

کەواتە ئەوانەی کەوا کافر و بێ بڕوان کوشتار دەکەن و دەجەنگن لە پێناو طاغوتان جا ئەوانە دەبێت بکوژرێن و ڕووبەڕویان ببنەوە موسوڵمانەکان، مەناطی حوکمەکە لەو ئایەتەدا بریتییە لە کوشتار کردن لە پێناو طاغوتان واتە هەر

کەسێک کوشتار بکات لە پێناو طاغوتان ئەو کاتە کافر و بێ بڕوایە و لە ڕیزی ئەوان حیسابە و ناوی کافرایەتی لێ دەنرێت و حوکمی حوکمی کافر و طاغوتەکانە.

٣-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ (البقرة : ٩٨)

واتە: هەر کەسێک دوژمنی الله و فریشتەکانی الله و پێغەمبەرانی و جوبرەئیل و میکائیل بێت (ئەوە بێ بڕوایە) وە بێگومان الله ـش دوژمنی بێ بڕوایانە.

مەناطی حوکم لەو ئایەتەدا ئەوەیە کەوا دژایەتی و دوژمنایەتی الله تعالی و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئاینەکەی کەسەکە پێیوە کافر دەبێت و لە ئیسلام دەر دەچێت.

کەواتە هەموو سیستەم و داموو دەزگاکانی ئەمن و سەربازی و ڕاگرتنی کوفر و ستەمەکانی فیرعەون لە لایەن ڕاگەیاند کارەکان و لە لایەن قارون سیفەتەکان و وە قارون و بواری ئابوری و دارایی ڕاگرتن بۆیان ئەوە هەر هەمووی دژ و دوژمنن بە الله تعالی یان بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یان بە شەریعەتی ئیسلام جا هەر

کەسێک کەواتە لەو شوێنانە بەشدار بێت مەناطی حوکمەکەی دەیگرێتەوە کەواتە دژە و دوژمنکارە بە الله تعالی و بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئاینەکەی هەر کەسێکیش دژ و دوژمنکار بێت بە الله تعالی و بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بە ئاینەکەی بە دڵنیاییەوە کافرە و لە ئیسلام دەرچووە، جا ئەو مەناطی حوکمانە هەر هەموویان ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بەشدارن لەو دەزگا و لەو شوێنانە و ئەندامن تێیدا.

## جا با هەندێک لە وتە بەنرخەکانی زانایان لەو بارەوە بێنینەوە:

١-پێشەوا ابن حزم الأندلسي -رحمه الله- لە المحلی کیتابە نایابە پڕ نرخ و بەهاکەی لە (١١/ ٢٠٠) فەرموویەتی: **(ولو أن كافرا مجاهدا غلب على دار من دور الإسلام وأقر المسلمين بها على حالهم الا انه هو المالك لها المنفرد بنفسه في ضبطها وهو معلن بدين غير الاسلام لكفر بالبقاء معه كل من عاونه وأقام معه وان ادعى أنه مسلم)** پەنا بە الله تعالی دەبێت بۆ حاڵی خۆمان بگرێین سەرنج بدەن چی فەرمووە ئەو زانا بەرێزە، دەفەرمووێت ئەگەر کافرێکی بە ئاشکرا کافر زاڵبوو بەسەر دار و وڵات و شوێنێک لە دار و وڵاتی شوێنی ئیسلام داگیری کرد و دەسەڵاتدار بوو بەسەریەوە وە موسوڵمانەکانی هێشتەوە لەسەر حاڵ و باری

خۆیان که ئەگەر بمێننەوە بە موسوڵمانێتیش بەڵام ئەو خاوەنیان بوو سەرپەشتیاریان بوو بە تەنها خۆی کار و بارەکانی ضەبت دەکرد و بەڕێوەی دەبرد جا ئەو بە ئاشکرایی ڕێباز و ڕێگایەکی جگە لە ئیسلامی هەبوو جا ئەو کەسانەی کەوا لەوێ دەمێننەوە کە یارمەتی دەدەن یان تەنیا لەگەڵی دەمێننەوە و دەڵێن موسوڵمانین ئەوانە کافر بوون و کافر دەبن پەنا بە الله تعالی، وە هەر لە المحلی لە شوێنێکی تر لە هەمان لاپەڕەدا فەرموویەتی: **(وكذلك من سكن بارض الهند والسند والصين والترك والسودان والروم من المسلمين فان أن لا يقدر على الخروج من هنالك لثقل ظهر أو لقلة مال أولضعف جسم أولا متناع طريق فهو معذور)** بەوە تۆزێک دڵمان خۆش دەبێت، کە دەفەرمووێت هەریەک لە زەوی هیند سیند سین تورک سودان ڕۆمەکان و ئەوروپا (ئەو کاتە ئەوانە هەمووی دار الكفر بووە) لە موسوڵمانان لەوێ نیشتەجێ بێت و بمێنێتەوە ئەگەر لە توانایدا نەبوو دەربچێت بۆ دار الإسلام لەوێ مایەوە لەبەر ئەوەی باری قورس بوو یان ماڵ و سامانی کەم بوو نەبوو نەیدەتوانی پێی بگات بە دار الإسلام یان لاشە و جەستەی زەعیف و لاواز بوو نەیدەتوانی بڕوا یان ڕێگا نەبوو ڕێگای لێ گیرا بوو ئەوانە هەموویان عوذر و بیانوون بۆ ئەوەی لەوێ بمێنێتەوە، **(فان كان هنالك**

**محار باللمسلمين معينا للكفار بخدمة أو كتابة فهو كافر)** بەس لەوێ بمێنێتەوە و بە بێدەنگی و هیچ زەرەر و زیانی نەبێت بۆ موسوڵمانان ئەو عوذر و بیانوانەی هەبێت گوناحبار نابێت بەڵام ئەگەر ماوە دژایەتی موسوڵمانان بکات وە یارمەتی دەربێت بۆ کافرەکان بەوەی خزمەتیان بکات یان بە نوسراو و نوسینێکیش بێت ئەوە کافر دەبێت و لە ئیسلام دەر دەچێت پەنا بە الله تعالى.

٢-ئیبن تیمیه -رحمه الله- له مجموع الفتاوى (٣٤/ ١٣٦ – ١٣٧) فەرموویەتی:

**(أما إذا قتله على دين الإسلام : مثل ما يقاتل النصراني المسلمين على دينهم : فهذا كافر شر من الكافر المعاهد ، فإن هذا كافر محارب بمنزلة الكفار الذين يقاتلون النبي صلى الله عليه وسلم وأصحابه وهؤلاء مخلدون في جهنم ، ، كتخليد غيرهم من الكفار)** ئیبن تیمیه پرسیاری لێکرا گوتیان کەسێک بێت موسوڵمانێک بکوژێت لەسەر دینداریەکەی یان بیگرێت و ئەشکەنجەی بدات ئەوە حوکمی چییە؟

گوتی هەر کەسێک لەسەر ئاینی ئیسلام کەسێک بکوژێت: وەکو ئەوەی کەوا نەسڕانیەکان موسوڵمانان لەسەر موسوڵمانێتی و دینداریەکەیان دەکوژن: ئا ئەو کەسە کافرە وە کوفرەکەی لەو کافرانە خراپترە کە عەهدیان لەگەڵ کراوە لە

لایەن موسوڵمانەکان و بەڵێن و پەیمان لە نێوانیان هەیە، جا ئەو کەسە کافر دەبێت بە کافرێکی محاریب و دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان لە ڕیز و لە پایەی ئەو کافرانە دەبێت کەوا شەڕ و کوشتاریان لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سەحابیەکانی پێغەمبەر کردووە (صلى الله عليه وسلم) (رضي الله عنهم) جا ئەوەی ئاوا بکات و موسوڵمانان لەسەر دینداری و موسوڵمانێتی بکوژێت هەمیشەیی دەبێت لە ئاگری جەهەنم،، وەکو کافرەکانی جگە لەو کەوا هەمیشەین لە ئاگری دۆزەخ.

وەرن وەڵامتان لە کوێ بوو ئاگاداری خۆتانبن موسوڵمانان نەگرن ئەشکەنجەیان مەدەن الله بەیەکگران خاوەن بیروبڕواکان دیندار و موسڵمانەکان لەسەر دینداری، ئەو داموو دەزگایانەی فیرعەون لە کاتی خۆی بەنوو ئیسرائیلیەکانی لەسەر ئەوە دەکوشت چونکە دیندار بوون موسوڵمان بوون منداڵ و نێرینەکانی دەکوشت ئافرەتەکانی جێدەهێشت و خزمەتی خۆیانی پێدەکرد و دەی چەوساندنەوە، وە داموو دەزگا ئەمنی و سەربازی و پۆلیسی و ئەو بوارانەش لە هەر کات و سەردەمێکدا و بە سەردەمی ئێمە و لە وڵاتەکەی خۆمان و وڵاتانی تریش زۆر جار مل لەبەر ملی موسوڵمانانی الله بەیەکگری خاوەن تەوحید دەنێن لەسەر دینداری و لەسەر تەوحید و الله بەیەکگرتنەکەیان لەسەر موسوڵمانێتیەکەیان

ڕاویان دەنێن دەیانگرن دەیانکوژن ئەشکەنجەیان دەدەن پەنا بە الله تعالی، ئەوە فتواکەی ئیبن تیمیە بوو بە دڵنیاییەوە هەر بەوەندە ئیش و کارە ئەگەر کەسێک وا بکات لە ئیسلام دەردەچێ و کافر دەبێت.

٣-ابن حجر العسقلاني -رحمه الله- له فتح الباري (٣/ ٦١) فەرموویەتی: **(ويستفاد من هذا مشروعية الهرب من الكفار ومن الظلمة لأن الإقامة معهم من إلقاء النفس إلى التهلكة ، هذا إذا لم يعنهم ولم يرض بأفعالهم فإن أعان أو رضي فهو منهم)** دەفەرمووێ لەو فەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) کەوا فەرموویەتی: ﴿**إذا أَنْزَلَ اللَّهُ بقَوْمٍ عَذابًا، أصابَ العَذابُ مَن كانَ فيهم، ثُمَّ بُعِثُوا علَى أعْمالِهِمْ**﴾ پێغەمبەر فەرمووی (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر الله تعالی بیەوێ عەزاب بۆ سەر قەوم و گەلێک بنێرێت و توشی عەزابیان بکات، ئەوانەی لەگەڵیانن و لە ناویاندان عەزابەکەیان توش دەبێت، بەڵام هەر کەسە و بە گوێرەی نیەت و عەمەل و کردەوەکەی خۆی زیندوو دەکرێتەوە، کە لە سەحیحی بوخاری بە ژمارە ٧١٠٨ هاتووە ابن حجر دەفەرمووێت لەو فەرموودە ئەوە وەردەگیرێت کەوا دروستە موسوڵمانان و خەڵکی لەبەر دەستی کافرەکان و زاڵم و ستەمکاران هەڵبێن و ڕا بکەن چونکە مانەوە لەگەڵیان بەڕاستی توشی لەناو چوون و بە

هیلاک چوون و عەزابیان دەکات، جا ئەوە ئەگەر ماوە لەگەڵیان بەبێ ئەوەی یارمەتیان بدات لە پاشان ڕازی نەبێت بە فیعل و کردارەکانیان ئەی ئەگەر ڕازی بوو بە فیعل و کرداریان و یارمەتیاندان ئەوە هەر لەوانە.

واتە ئەوە ئەوە دەگەیەنێت بە ڕازی بوون یان یارمەتیدان و بەشداری لەو دەموو دەزگا و شوێنانە کە یارمەتیدانی تێدایە و ڕازی بوونە لێیان ئەوە کوفرە و لەوانە واتە وەکو ئەوانە و کافر دەبێت ئەگەر ستەمکاربن تەنها و کافر نەبووبن ستەمکار دەبێت.

٤-شێخ محمد بن عبد الوهاب -رحمه الله- له الرسائل الشخصية (ل : ٢٧٢) بەشی پێنجەم لە دانراوەکانی شێخ محمد بن عبد الوهاب لە چاپکردنی زانکۆی الامام محمد بن سعود فەرموویەتی: **(واعلموا أن الأدلة على تكفير المسلم الصالح إذا أشرك بالله ، أو صار مع المشركين على الموحدين ولو لم يشرك أكثر من أن تحصر من كلام الله وكلام رسوله وكلام أهل العلم كلهم)** دەفەرمووێت بزانن شارەزابن بەڕاستی بەڵگەکان لەسەر کافر کردنی موسوڵمانێکی چاک ئەگەر شیرکی کرد بە الله تعالی، یان لەگەڵ موشریک و هاوبەش پەیداکارەکان بوو بە گەڵیان کەوت لە دژی موسوڵمانەکانی موەحیدی الله بەیەکگر ئەگەر شیرک و

هاوبەشیشی نەکردبێت بەڵگەکان زۆر لەوە زیاترن کەوا کورت هەڵبهێندرێن و بژمێردرێن هەم لە وتە و قسەکانی الله تعالی و هەم لە قسە و وتەکانی پێغەمبەری الله (ﷺ) وە هەم لە قسە و گوتەکانی ئەهلی عیلم و زانایان هەموویان بە تێکڕا.

کەواتە بەس لەگەڵدا بونیان ئەگەر بێت و شیرک و کوفریش نەکات بەڕاستی هەر کەسەکە پێی موشریک و کافر دەبێت و بەڵگەکان یەکجار زۆرن واتە لە قورئان و لە فەرموودە و لە وتەی زانایان ئەوەش قسەی شێخ محمد بن عبد الوهاب بوو، جا بەشداری لەو داموو دەزگایانە بە دڵنیاییەوە بەشداری و هاوبەشییە لەگەڵ موشریک و کافرەکان ئەوکات حوکم و بڕیاری ئەوانیان بەسەردا دەدرێت.

# له کۆتاییدا

بەڕێزان و خۆشەویستان دەڵێین تاوانی گەورەی یارمەتیدانی طاغوتان لەوە دایە دەسەڵاتداری کافر و طاغوت بە خۆی هیچی پێ ناکرێت و لە دەستی نایەت ئەگەر هاوکاری و دار و دەستە و پاسەوان و سەربازەکان و پۆلیسەکان نەبن کەوا پاڵپشتی بکەن و یارمەتی بدەن و یان مێزەر بەسەرەکان کە ڕاگەیاندنی بۆ بکەن و سام و هەیبەت و گەورەیی ئەوان لەناو دڵی خەڵکەکە دابنێن تا خەڵک بە گەورەیان بناسن و لێیان بترسن، جا فیرعەون نەیدەتوانی هیچ بکات و کوفر و طاغوتیەتەکەی بچەسپێنێت بەبێ یارمەتیدانی دار و دەستەکەی و دەوروبەر و نزیکەکانی و سیستەمە کوفریەکەی بە تەواوەتی پێ لەسەر دابگرێت ئەگەر لەسەر ئەو سێ پێگە نەوەستابا:

١-دەسەڵاتی سیاسی و بەڕێوە بردنەکەی و سەربازیەکەی کە لە دەستی هامان و سەربازەکانیدا بوو.

٢-دەسەڵاتی ئابوری و داراییەکەی کە قارون بۆی سەرپەرشتی دەکرد.

٣-دەسەڵاتی ڕاگەیاندن و چەواشەکردنی خەڵکی کە جادوگەرەکانی بوون.

جا خەڵکی دەکوشت و سەربازەکانی بوون خەڵکیان بۆ دەکوشت و ڕاو بۆچونی لە دەوروبەرەکەی خۆی وەردەگرت و ڕاویژی پێ دەکردن، ماڵ و سامانی کە لە خەڵکی دەستاندەوە لە دواتر دەی چەوساندنەوە وە ئازار و ئەشکەنجەی دەدان و وای لێ دەکردن کە ئەوان گوێڕایەڵی ڕەهایی ئەو بکەن و پەرستنی ئەویان لە لا قبوڵبێت و فەرمانەکانی ڕەت نەکەنەوە و جێبەجێی بکەن، جا لە هەموو سەردەمێکیش فیرعەون و فیرعەون سیفەتەکان هەر وان و لەسەر ئەو پێگانە خۆیان ڕاگرتوە، سەرباز و پۆلیس و ئاسایش و داموو دەزگاکانی تری ئەمنی و سەربازی و دارایی و ئابوری و وە ڕاگەیاندن و مێزەر بە سەرەکان بۆیان، ئەوانەن کەوا ڕایاندەگرن و لە سیستەمە کوفریەکەیان بەردەوام دەکەن، لە هەموو وڵات و شوێنێک دەبێت ئاگاداربن ئەوانە لە الله بترسن و بگەڕێنەوە لای الله و تۆبە بکەن چونکە ئاکام و کۆتایی ژیانی دونیایان لەگەڵ فیرعەون و دار و دەستەکەیەتی کە ئەوان لەناو دەچن ئەوانیش لەناو دەچن لە قیامەتیشدا لەگەڵ ئەوان دەبن و حیسابی ئەوانیان بۆ دەکرێت لە لای الله تعالی کە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ (سورة هود : ١١٣) واتە: پاڵ مەدەن بەوانەوە کە

ستەمیان کردووە چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن و بێجگە لە الله هیچ پشتیوانێکتان نابێ پاشانیش یارمەتی نادرێن.

لە تەفسیری ئەو ئایەتە زانایان و پێشینان گوتویانە لە ڕۆژی دوایدا دەگوترێت: **(أين الظلمة وأعوانهم ؟)** کوان ئەوانەی زوڵم و ستەمیان دەکرد و یارمەتی دەرەکانیان؟ **(فيجمعون في توابيت من نار ، ثم يقذف بهم في النار .)** هەموویان کۆ دەکرێنەوە لە چاڵێکی ئاگرین، و پاشان هەڵدەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ پەنا بە الله، ئەوە لە ئەثەردا هاتووە وەکو ئیبن تیمیە لە مجموع الفتاوى لە (٧/ ٦٧) هێناویێتی.

کەواتە یارمەتی دەرانی ستەمکاران بریتین لە جانتا هەڵگران و شمەک شۆران و جلو بەرگ دوورەکانن بۆیان و بەدواوەیانەوەدا دەڕۆن، جا الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ﴾ (**الفجر : ١٠**) ئەوتاد زانایان و ئیمامی تەبەریش لە تەفسیرەکەی دەفەرموێت لەو شوێنەدا مەبەست پێی جونود و سەربازەکانی فیرعەونە واتە ئەوان وەکو دینگەیەک لە عەرز چەقی بوون و فیرعەونیان لەسەر و خۆیانەوە ڕاگرتبوو نەیاندەهێشت بهەژێت و لەناو بچێت فیرعەون.